بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي أمر بالجهاد في سبيله، ووعد عليه الأجر العظيم والنصر المبين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له القائل في كتابه الكريم (وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نصْرُ الْمُؤْمِنِينَ)الروم:٤٧ وأشهد أن محمدا عبده ورسوله وخليله قائد المجاهدين وأصدق المناضلين وأنصح العباد أجمعين ﷺ وعلى آله الطيبين الطاهرين، وعلى أصحابه الكرام الذين باعوا أنفسهم لله وجاهدوا في سبيله حتى أظهر الله بهم الدين وأعز بهم المؤمنين، وأذل بهم الكافرين رضي الله عنهم وأكرم مثواهم وجعلنا من أتباعهم بإحسان إلى يوم الدين.

دایکی ئیماندارانی عائیشه(رضی اللّه عنها) دەڵێ: لەهەموو کاتەکانی شەودا پێغەمبەر ﷺ ویتری کردووە، لەسەرەتای شەوداو لە ناوەڕاستی شەوداو، لەکۆتایی شەودا، [لەکۆتایی تەمەنیدا] ویترەکەی بردۆتە کاتی پارشێو .

(عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ : مِنْ كُلِّ اللَّيْلِ قَدْ أَوْتَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ أَوَّلِ اللَّيْلِ وَأَوْسَطِهِ وَآخِرِهِ، فَانْتَهَى وِتْرُهُ إِلَى السَّحَرِ). مسلم ١٧٤٥ والبخاري ٩٩٦

## چۆن چۆنی نوێژی ویتر دەکرێت ؟

شعبة دەڵێ: بیستم عوقبەی کوڕی حورەیث، دەڵێ: بیستم ابن عمر(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) دەیگێڕایەوە کە رسول اللّه ﷺ فەرموویەتی: شەو نوێژ دوو دووە ، ئەگەر بینیت کە بەیانیت بۆ دەردەکەوێت ، ویتر بکە بە یەک ، وترا بە ابن عمر: [مَثْنَى مَثْنَى] دوو دوو واتای چییە؟ ووتی: ئەوەیە کە سەلام بدەیتەوە لەهەموو دوو ڕکات جارێک .

(حَدَّثَنَا شُعْبَةُ ، قَالَ : سَمِعْتُ عُقْبَةَ بْنَ حُرَيْث ، قَالَ : سَمِعْتُ ابْنَ عُمَرَ يُحَدِّثُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : " صَلَاةُ اللَّيْلِ مَثْنَى مَثْنَى ، فَإِذَا رَأَيْتَ أَنَّ الصُّبْحَ يُدْرِكُكَ ؛ فَأَوْتِرْ بِوَاحِدَةٍ ". فَقِيلَ لِابْنِ عُمَرَ : مَا مَثْنَى مَثْنَى ؟ قَالَ : أَنْ يُسَلِّمَ فِي كُلِّ رَكْعَتَيْنِ).

رواه مسلم ١٧٤٩ ، و البخاري ٩٩٥ .

## ویتر بکەن ئەی ئەهلی قورئان :

ئیمامی عەلی (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) دەڵێ: نوێژی ویتر واجب نەنوسراوە لەسەرتان وەک نوێژەفەرزەکان کە لەسەرتان نوسراوە، بەڵکو سوننەتی پێغەمبەری اللّٰه یە ﷺ فەرموویەتی: بەڕاستی اللّٰه تاکەو تاکیشی خۆشەوێ ، ئەی ئەهلی قورئان نوێژی ویتر بکەن ، ئیمامی الترمذي دەڵێ: وە لە بابێکی تر لە ابن عمر و ابن مسعود و ابن عباس هاتووە ، فەرموودەکە لای من فەرموودەیەکی حەسەنە .

(عَنْ عَلِيٍّ قَالَ : الْوِتْرُ لَيْسَ بِحَتْمٍ كَصَلَاتِكُمُ الْمَكْتُوبَةِ، وَلَكِنْ سَنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَقَالَ : " إِنَّ اللَّهَ وِتْرٌ يُحِبُّ الْوِتْرَ، فَأَوْتِرُوا يَا أَهْلَ الْقُرْآنِ ". وَفِي الْبَابِ عَنِ ابْنِ عُمَرَ وَابْنِ مَسْعُودٍ وَابْنِ عَبَّاسٍ. حَدِيثُ عَلِيٍّ حَدِيثٌ حَسَنٌ).
سنن الترمذي ا ٤٥٣ ا.

## لە نوێژی ویتر پێغەمبەر ﷺ کام سورەتانەی دەخوێند ؟

أُبيِّ بْنِ كَعْب(رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەڵێ: رسول اللّٰهﷺ لە نوێژی ویتر (سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى) و (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ) و (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) دەخوێند، کاتێک سەلامی دەدایەوە دەیفەرموو: (سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ) سێ جار .

عَنْ أُبَيِّ بْنِ كَعْبٍ قَالَ : كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَقْرَأُ فِي الْوِتْرِ بِـ { سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى }، وَ { قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ }، وَ { قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ }، فَإِذَا سَلَّمَ قَالَ : " سُبْحَانَ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ ". ثَلَاثَ مَرَّاتٍ.

سنن النسائي | ١٧٢٩ |.

## ویتر بکەن پێش ئەوەی ڕۆژ بێتەوە :

له أبي سعيد(رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) كه پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ویتر بکەن پێش ئەوەی ڕۆژ بێتەوە .

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ : " أَوْتِرُوا قَبْلَ أَنْ تُصْبِحُوا ".
رواه مسلم ١٧٥٤.

## ئەوەی دەترسێ لەکۆتایی شەودا بەئاگانەیتەوە با لەسەرەتاوە ویتر بکات :

جابر(رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەڵێ: رسول اللّٰه ﷺ فەرموویەتی: ئەوەی دەترسێ لەکۆتایی شەودا بەئاگانەیەتەوە با لەسەرەتای شەوەوە ویترەکەی بکات، ئەوکەسەیش کە بەتەمایە لەکۆتایی شەودا هەستێ با لە کۆتایی شەودا ویترەکەی بکات، چونکە نوێژی کۆتایی شەو فریشتەکان شایەتی بۆ دەدەن، ئەمەشیان باشترە . أبو معاوية دەڵێ: ئامادە دەبن[ واتە فریشتەکان ].

عَنْ جَابِرٍ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " مَنْ خَافَ أَنْ لَا يَقُومَ مِنْ آخِرِ اللَّيْلِ فَلْيُوتِرْ أَوَّلَهُ، وَمَنْ طَمِعَ أَنْ يَقُومَ آخِرَهُ فَلْيُوتِرْ آخِرَ اللَّيْلِ ؛ فَإِنَّ صَلَاةَ آخِرِ اللَّيْلِ مَشْهُودَةٌ ، وَذَلِكَ أَفْضَلُ ". وَقَالَ أَبُو مُعَاوِيَةَ : مَحْضُورَةٌ.
رواه مسلم ١٧٥٥.

## چۆنیەتی شەونوێژوو نوێژی ویتری پێغەمبەرﷺ:

زرارە دەڵێ: سعدی کوڕی هشام کوڕی عامر ویستی غەزا بکات لەڕێی اللّٰه (عزوجل) هات بۆ مەدینە، ویستی ئەو زەوییەی لەمەدینە هەیبوو بیفرۆشێت، بیدات بەچەک و تفاقی جەنگی، بۆ ئەوەی تا ئەمرێت غەزای ڕومی پێبکات، کە هاتە مەدینە گەیشت بەچەند کەسێک لەخەڵکی مەدینە، ڕێگایان نەدا ئەوکارە بکات، پێیان ڕاگەیاند کە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کۆمەڵێکی شەش کەسی ویستیان ئەو کارە بکەن، بەڵام پێغەمبەرﷺ ڕێگای پێنەدان و پێی فەرموون: (ئایا لەمنا پێشەنگی و سەر مەشقی نابینن؟) کاتێ ئەوەیان بۆ سەعد گێرایەوە، سەعد ژنەکەی گێرایەوە ژێرسایەی خۆی کە پێشتر تەلاقی دابوو، شایەتیشی لەسەر گێڕانەوەی ژنەکەی گرت، ئینجا سەعد هاتە خزمەت (ابن عباس)، پرسیاری ویتری پێغەمبەری ﷺ لێکرد، ئەویش پێی وت: بۆ کەسێکت نیشان نەدەم کە لەخەڵکی سەرزەویدا لەهەموو کەس شارەزاترە بە ویتری پێغەمبەری اللّٰه ﷺ ؟

ووتی: کێیە؟ ووتی(عائیشە) (رضي اللّٰه عنها)، بچۆ بۆ لای، لێی بپرسەو، لەدواییدا هەواڵەکەش بۆ من بهێنەرەوە [سەعد دەڵێ]کەوتمە ڕێ بۆ لای (عائشە)، لەڕێگادا چووم بۆ لای (حەکیم) کوڕی (افلح) داوام لێکرد کە لەگەڵما بێت ووتی: من نایەم بۆلای، چونکە ئاگادارم کرد کە لەناکۆکی نێوان ئەو دوو کۆمەڵە (علي و معاویە)دا هیچ نە ڵێ، بەڵام گوێی نەدایێ و قسەی تێداکرد ، سەعد وتی: سوێندم خوارد کە بێت (حەکیم) ئینجا هات و چووین بۆ لای عائیشە، داوای مۆڵەتمان لێکرد، ئەویش مۆڵەتی داین، چووینە ژوورەوە، عائیشە ووتی: تۆ حەکیمی؟ ناسیی، وتی: بەڵێ، ئەویش وتی: کێت لەگەڵدایە؟ ووتی: (سەعد کوڕی هیشام) ووتی: کام هیشام؟ وتی: کوڕی (عامر) دوعای خێری بۆکردو ناوی بەچاک برد. (قتادە) دەڵێ:عامر(رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) لەجەنگی (ئوحود) شەهیدبوو. سەعد دەڵێ: بە عائیشەم وت: ئە ی دایکی ئیمانداران، ئاگادارم بکە لەڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئایا تۆ قورئان ناخوێنی؟ وتم: بەڵێ، وتی: ڕەوشتی پێغەمبەر ﷺ قورئان بووە، ویستم هەستم و هەتا ماوم هیچ شتێ لە کەس نەپرسم، دوایی

بیرم کردەوە وتم: ئاگادارم بکە لەبارەی هەستانی شەوی بۆ شەونوێژ، ئەویش وتی: ئایا [ يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ] ناخوێنی؟ وتم: بەڵێ. ووتی: خوای گەورە لەسەرەتای ئەم سوورتەدا شەونوێژی فەرزکرد هەتا ساڵێک پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵانی کردیان، خوای گەورە کۆتایی ئەم سورەتەی دوانزە مانگ لەئاسمانا هێشتەوەو نەیناردە خوارەوە، لەدوای ساڵێک لە کۆتایی ئەم سوورەتەدا ئاسانکاریی ناردە خوارەوەو کردی بەسوونەت. دوای فەرزبوونی. سەعد دەڵێ: پرسیم لەعائیشەو وتم: ئەی دایکی ئیماندارانان ئاگادارم بکە لەویتری پێغەمبەر ﷺ ئەویش وتی: سیواک و ئاوی دەستنوێژمان بۆ ئامادە دەکرد ئەوەندەی خواویستی لەسەر بوایە لەشەوودا بێداری دەکردەوەو سیواکی دە کردو، دەستنوێژی دەشت و نۆ ڕکاتی دەکرد، لەڕکاتی هەشتەما نەبێ لەهیچیاندا دانەدەنیشت، کەدادەنیشت یادو سوپاسی خوای دەکردو دوعای دەکرد، سەلامی نەدەدایەوە هەڵدەستایەوە ڕکاتی نۆیەکی دە کرد، لەپاشا دادەنیشت و یادو سوپاسی خواو دوعای دەکردو ئینجا سەلامی دەدایەوە دەیدا بەگوێماندا. ئینجا دوو ڕکاتی بەدانیشتنەوە دە

کرد ئەوە یانزە ڕکات ئەی کوڕی شیرینم کاتێ پیربوو، گۆشتی گرت حەوت ڕکات ویتری دەکرد، هەرچۆن دوو ڕکاتی بەدانیشتنەوە لەدوای نۆ ڕکاتەکە دەکرد، لەدوای حەوتەکەش دوو ڕکاتەکەی بەدانیشتنەوە دەکرد ئەوە نۆ ڕکات ئەی کوڕی شیرینم، پێغەمبەر ﷺ هەر نوێژێکی بکردایە حەزی دەکرد کە بەردەوام بێت لەسەری ، هەرکاتێکیش خەو یا ئازار زۆری بۆ بهێنایەو نەیتوانیایە شەو هەستێ بەڕۆژدا دوانزە ڕکاتی دەکرد ، هەرگیز ئاگادارنیم کە پێغەمبەرﷺ لەشەوێکدا هەموو قورئانی خوێندبێت، هیچ شەوێک هەتا بەیانی نوێژی نەکردووە جگە لەمانگی ڕمەزانیش هیچ مانگێک بەتەواوی بە ڕۆژوو نەبووە. سەعد دەڵێ: چووم بۆلای (ابن عباس) (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) وەڵامەکەی (عائیشە)م (رضی اللّٰه عنها) بۆ بردەوە ئەویش ووتی: ڕاستی وتووە، ئەگەر من بچومایە بۆلای و سەردانم بکردایە، ئەچووم بۆئەوەی لەدەمی خۆی ئەمەم ببیستایە سەعد ووتی: ئەگەر بمزانیایە کە تۆ لێی دڵگرانی و سەردانی ناکەیت، فەرموودەکەیم بۆ نەدەگێرایتەوە .

عَنْ زُرَارَةَ : أَنَّ سَعْدَ بْنَ هِشَامِ بْنِ عَامِرٍ أَرَادَ أَنْ يَغْزُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، فَقَدِمَ الْمَدِينَةَ، فَأَرَادَ أَنْ يَبِيعَ عَقَارًا لَهُ بِهَا، فَيَجْعَلَهُ فِي السِّلَاحِ وَالْكُرَاعِ، وَيُجَاهِدَ الرُّومَ حَتَّى يَمُوتَ، فَلَمَّا قَدِمَ الْمَدِينَةَ لَقِيَ أُنَاسًا مِنْ أَهْلِ الْمَدِينَةِ، فَنَهَوْهُ عَنْ ذَلِكَ، وَأَخْبَرُوهُ أَنَّ رَهْطًا سِتَّةً أَرَادُوا ذَلِكَ فِي حَيَاةِ نَبِيِّ اللَّهِ ﷺ، فَنَهَاهُمْ نَبِيُّ اللَّهِ ﷺ ، وَقَالَ : " أَلَيْسَ لَكُمْ فِيَّ أُسْوَةٌ " ؟ فَلَمَّا حَدَّثُوهُ بِذَلِكَ رَاجَعَ امْرَأَتَهُ، وَقَدْ كَانَ طَلَّقَهَا، وَأَشْهَدَ عَلَى رَجْعَتِهَا، فَأَتَى ابْنَ عَبَّاسٍ، فَسَأَلَهُ عَنْ وِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ : أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى أَعْلَمِ أَهْلِ الْأَرْضِ بِوِتْرِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ؟ قَالَ : مَنْ ؟ قَالَ : عَائِشَةُ، فَأْتِهَا فَاسْأَلْهَا، ثُمَّ ائْتِنِي فَأَخْبِرْنِي بِرَدِّهَا عَلَيْكَ، فَانْطَلَقْتُ إِلَيْهَا، فَأَتَيْتُ عَلَى حَكِيمِ بْنِ أَفْلَحَ، فَاسْتَلْحَقْتُهُ إِلَيْهَا، فَقَالَ : مَا أَنَا بِقَارِبِهَا ؛ لِأَنِّي نَهَيْتُهَا أَنْ تَقُولَ فِي هَاتَيْنِ الشِّيعَتَيْنِ شَيْئًا، فَأَبَتْ فِيهِمَا إِلَّا مُضِيًّا. قَالَ : فَأَقْسَمْتُ عَلَيْهِ، فَجَاءَ، فَانْطَلَقْنَا إِلَى عَائِشَةَ ، فَاسْتَأْذَنَّا عَلَيْهَا، فَأَذِنَتْ لَنَا، فَدَخَلْنَا عَلَيْهَا. فَقَالَتْ : أَحَكِيمٌ ؟ فَعَرَفَتْهُ. فَقَالَ : نَعَمْ. فَقَالَتْ : مَنْ مَعَكَ ؟ قَالَ : سَعْدُ بْنُ هِشَامٍ. قَالَتْ : مَنْ هِشَامٌ ؟ قَالَ : ابْنُ عَامِرٍ، فَتَرَحَّمَتْ عَلَيْهِ. وَقَالَتْ خَيْرًا. قَالَ قَتَادَةُ : وَكَانَ أُصِيبَ يَوْمَ أُحُدٍ، فَقُلْتُ : يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، أَنْبِئِينِي عَنْ خُلُقِ رَسُولِ

اللَّه ﷺ. قَالَتْ : أَلَسْتَ تَقْرَأُ الْقُرْآنَ ؟ قُلْتُ : بَلَى. قَالَتْ : فَإِنَّ خُلُقَ نَبِيِّ اللَّه ﷺ كَانَ الْقُرْآنَ. قَالَ : فَهَمَمْتُ أَنْ أَقُومَ، وَلَا أَسْأَلَ أَحَدًا عَنْ شَيْءٍ حَتَّى أَمُوتَ، ثُمَّ بَدَا لِي، فَقُلْتُ : أَنْبِئِينِي عَنْ قِيَامِ رَسُولِ اللَّه ﷺ فَقَالَتْ : أَلَسْتَ تَقْرَأُ { يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ } ؟ قُلْتُ : بَلَى. قَالَتْ : فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ افْتَرَضَ قِيَامَ اللَّيْلِ فِي أَوَّلِ هَذِهِ السُّورَةِ، فَقَامَ نَبِيُّ اللَّه ﷺ وَأَصْحَابُهُ حَوْلًا، وَأَمْسَكَ اللَّهُ خَاتِمَتَهَا اثْنَيْ عَشَرَ شَهْرًا فِي السَّمَاءِ حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ فِي آخِرِ هَذِهِ السُّورَةِ التَّخْفِيفَ، فَصَارَ قِيَامُ اللَّيْلِ تَطَوُّعًا بَعْدَ فَرِيضَةٍ. قَالَ : قُلْتُ : يَا أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ، أَنْبِئِينِي عَنْ وِتْرِ رَسُولِ اللَّه ﷺ. فَقَالَتْ : كُنَّا نُعِدُّ لَهُ سِوَاكَهُ وَطَهُورَهُ، فَيَبْعَثُهُ اللَّهُ مَا شَاءَ أَنْ يَبْعَثَهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَيَتَسَوَّكُ، وَيَتَوَضَّأُ، وَيُصَلِّي تِسْعَ رَكَعَاتٍ، لَا يَجْلِسُ فِيهَا إِلَّا فِي الثَّامِنَةِ، فَيَذْكُرُ اللَّهَ، وَيَحْمَدُهُ، وَيَدْعُوهُ، ثُمَّ يَنْهَضُ وَلَا يُسَلِّمُ، ثُمَّ يَقُومُ، فَيُصَلِّ التَّاسِعَةَ، ثُمَّ يَقْعُدُ، فَيَذْكُرُ اللَّهَ، وَيَحْمَدُهُ، وَيَدْعُوهُ، ثُمَّ يُسَلِّمُ تَسْلِيمًا يُسْمِعُنَا، ثُمَّ يُصَلِّي رَكْعَتَيْنِ بَعْدَمَا يُسَلِّمُ وَهُوَ قَاعِدٌ، وَتِلْكَ إِحْدَى عَشْرَةَ رَكْعَةً يَا بُنَيَّ، فَلَمَّا سَنَّ نَبِيُّ اللَّه ﷺ ، وَأَخَذَ اللَّحْمَ أَوْتَرَ بِسَبْعٍ، وَصَنَعَ فِي الرَّكْعَتَيْنِ مِثْلَ صَنِيعِهِ الْأَوَّلِ، فَتِلْكَ تِسْعٌ يَا بُنَيَّ، وَكَانَ نَبِيُّ اللَّه ﷺ إِذَا صَلَّى صَلَاةً أَحَبَّ أَنْ

يُدَاوِمَ عَلَيْهَا، وَكَانَ إِذَا غَلَبَهُ نَوْمٌ أَوْ وَجَعٌ عَنْ قِيَامِ اللَّيْلِ صَلَّى مِنَ النَّهَارِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ رَكْعَةً، وَلَا أَعْلَمُ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ قَرَأَ الْقُرْآنَ كُلَّهُ فِي لَيْلَةٍ، وَلَا صَلَّى لَيْلَةً إِلَى الصُّبْحِ، وَلَا صَامَ شَهْرًا كَامِلًا غَيْرَ رَمَضَانَ. قَالَ : فَانْطَلَقْتُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ فَحَدَّثْتُهُ بِحَدِيثِهَا. فَقَالَ : صَدَقَتْ، لَوْ كُنْتُ أَقْرَبُهَا، أَوْ أَدْخُلُ عَلَيْهَا لَأَتَيْتُهَا حَتَّى تُشَافِهَنِي بِهِ. قَالَ : قُلْتُ : لَوْ عَلِمْتُ أَنَّكَ لَا تَدْخُلُ عَلَيْهَا مَا حَدَّثْتُكَ حَدِيثَهَا) 📚رواه مسلم ا ١٧٤٦ ا.

---------------------------

هەستن نوێژی ویتر بکەن و بپاڕێنەوە لە اللّٰه چونکە لەشەودا ساتێک هەیە کە دوعای تێدا وەردەگیرێت و اللّٰه تعالی دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا :

لە أبي هريرة (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) لە رسول اللّٰهﷺ فەرموویەتی: هەموو شەوێک کاتێ سێیەکی شەو تێدەپەڕێت، خوای گەورە دادەبەزێتە ئاسمانی یەکەمی دونیاو دەفەرموێت: من پادشام، من پادشام، کێ داخوازی هەیە لێم با وەڵامی بدەمەوە، کێیە داواکاریی لێم هەیە تا بیدەمێ ؟ کێیە داوای لێخۆشبوونم لێدەکات تالێی خۆشبم، هەر بەوشێوەیە دەبێ هەتا بەرەبەیان ڕووندەبێتەوە .

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ : " يَنْزِلُ اللَّهُ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا كُلَّ لَيْلَةٍ حِينَ يَمْضِي ثُلُثُ اللَّيْلِ الْأَوَّلُ، فَيَقُولُ : أَنَا الْمَلِكُ أَنَا الْمَلِكُ ؛ مَنْ ذَا الَّذِي يَدْعُونِي فَأَسْتَجِيبَ لَهُ، مَنْ ذَا الَّذِي يَسْأَلُنِي فَأُعْطِيَهُ، مَنْ ذَا الَّذِي يَسْتَغْفِرُنِي فَأَغْفِرَ لَهُ، فَلَا يَزَالُ كَذَلِكَ حَتَّى يُضِيءَ الْفَجْرُ ".

رواه مسلم |٧٥٨| ، والبخاري |١١٤٥|.

جابر (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) دەڵێ: بیستم پێغەمبەرﷺ دەیفەرموو: لەشەودا ساتێک هەیە ئەگەر موسوڵمان ڕێکەوتی بکات لەکاتێکا لە اللّٰه دەپارێتەوە بۆ کاری خێری دونیاو قیامەت ئەوا داواکاریەکەی بۆ دابین دەکات، ئەوساتەش لەهەموو شەوێکدا هەیە .

عَنْ جَابِرٍ قَالَ : سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ : " إِنَّ فِي اللَّيْلِ لَسَاعَةً، لَا يُوَافِقُهَا رَجُلٌ مُسْلِمٌ يَسْأَلُ اللَّهَ خَيْرًا مِنْ أَمْرِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ إِلَّا أَعْطَاهُ إِيَّاهُ، وَذَلِكَ كُلَّ لَيْلَةٍ ) 📚رواه مسلم ١٧٥٧.

## کردنی نوێژی ویتر دوو دوو پاشان له کۆتایی یه‌ک ڕکات:

ئیمامی الأوزاعي رحمه اللّٰه دەربارەی جیاکردنەوەی نوێژی ویتر ده لێ: له جیاکردنەوەی نێوان دوو ڕکات و وه ڕکاتی کۆتایی ئه‌گه‌ر بیکات شتێکی باشه وه ئه‌گه‌ر ته‌رکی بدات [ هه‌ر سێ ڕکاته‌که به‌یه‌که‌وه بکات ] هه‌ر باشه .

قَالَ الْأَوْزَاعِيُّ : في الْفَصْلِ بَيْنَ الرَّكْعَتَينِ وَالرَّكْعَةِ الْآخِرَةِ: إِنْ فَعَلَ فَحَسَنٌ وَإِنْ تَرَكَهُ لَمْ يَفْعَلْ فَحَسَنٌ)

📚الأوسط في السنن والإجماع والاختلاف ا ٥/١٨٦ ا.

أبو داود السجستاني دەڵێ: بیستم أحمد دەیوت: پێم باشه له ویتر له دوو ڕکعەته‌که سەلام بداتەوه .

أبو داود دەڵێ: ئیمامی مزگەوتەکەی أحمد ئاوای دەکرد لە مانگی ڕەمەزاندا، لە دوو ڕکعەتەکەدا سورەتی (الأعلى) و (الكافرون)ی دەخوێند، پاشان سەلامی ئەدایەوە لە دوو ڕکعەتەکە، پاشان هەڵدەستایەوە ڕکعەتێکی تری ئەکرد سورەتی (الفاتحة) و (الإخلاص) ی دەخوێند . 📚مسائل الإمام أحمد برواية أبي داود ا ٤٦٠ ا.

أبو داود دەڵێ: بیستم أحمد پرسیاری لێ کرا دەربارەی کەسێک ویتر دەکات بە نۆ ڕکات ؟ ووتی: ئەگەر هاتوو ویتری کرد بە نۆ ڕکات دانانیشێت ئیللا لە هەشتەم ڕکات نەبێت .
[ واتە هەشت ڕکات دوو دوو دەکات پاشان پشوو دەدات و بە ڕکاتێک کۆتایی پێ دەهێنێت ، یان سێ ڕکات دەکات دوای هەشت ڕکاتەکە ئەمەش دەکاتە یانزە ڕکات و ڕکاتی کۆتایی یەک ڕکاتە ، واللّٰه اعلم ]
سمعت أحمد سئل عمن يوتر بتسع ؟ قال : إذا كان يوتر بتسع فلا يقعد إلا في الثامنة . 📚مسائل الإمام أحمد برواية أبي داود ا ٤٦١ ا.

أبو داود دەڵێ: بیستم أحمد دەیوت دەربارەی کەسێک ویتر دەکات لە سەرەتای شەودا ، پاشان هەڵدەستێ نوێژ دەکات ؟ ووتی: نوێژ دەکات دوو ڕکات دوو ڕکات ، پێی وترا: وە ویتری لەسەر نییە ؟ ووتی: نا ، أبو داود دەڵێ: وە بیستم لێیەوە پرسیاری لێ کرا دەربارەی کەسێک ویتر دەکات دواتر نوێژ دەکات دوو دوو ؟ ووتی: بەڵێ ، بەڵام دوای ویتر خەوتن هەیە .

[واتە ویترەکەی بباتە کۆتایی شەووەوو دوای ویتر بخەوێت باشترو چاکترە ، واللّٰه اعلم ].

سمعت أحمد يقول فيمن أوتر أول الليل ، ثم قام يصلي ؟ قال : يصلي ركعتين ركعتين، قيل: وليس عليه وتر ؟ قال : لا ، وسمعته وسئل عمن أوتر يصلي بعدها مثنى مثنى ؟ قال : نعم؛ ولكن يكون بعد الوتر ضجعة.

📚مسائل الإمام أحمد برواية أبي داود ا ٤٦٤ ا.

## ئەوانەی نوێژی ویتر تەرک دەکەن !!

ئیمامی شافعی دەڵێ: نوێژی ویتر ، ئەوەی وازی لێ بێنێت حاڵی خراپ ترە لەو کەسەی واز لەهەموو سوننەتەکانی شەو و ڕۆژ دێنێت .

قال الإمام الشافعي: «الوتر.. من تركها كان أسوأ حالاً ممن ترك جميع النوافل في الليل والنهار» 📚كتاب الأم للشافعي | ١/٨٧ |.

صالح دەڵێ: پرسیارم کرد لە بارەی پیاوێک نوێژی ویتر تەرک دەکات بە عەمدەن چی لەسەرە لەم بارەیەوە ؟ باوکم(ئیمامی أحمد) وتی: ئەمە پیاوێکی خراپە ، ئەوە سوننەتە سوننەتی رسول اللّٰه ﷺ و هاوەڵەکانیەتی .

وسألته عن الرجل يترك الوتر متعمداً ما عليه في ذلك؟ قال أبي : هذا رجل سوء، هو سنة سنها رسول اللّٰه ﷺ واصحابه .

مسائل الإمام أحمد بروايه ابنه صالح | صـ : ٢٦٦ | رقم أثر (٢٠٦).

ابن قدامة دەڵێ: أحمد ووتی: هەر کەسێک نوێژی ویتر تەرک بکات بە عەمدی ئەوە پیاوێکی خراپە ، وە نابێت کە شایەتی لێ وەربگیرێت .

قال ابن قدامة ، قال أحمد: من ترك الوتر عمدا فهو رجل سوء، ولا ينبغي أن تقبل له شهادة . 📚المغني ا جـ ٢/صـ ١١٨ ا.

کارێکی ئاسان و پاداشتێکی زۆروو خۆشەویست لای اللّٰه تعالی ئەو کردەوەیەیە کە بەردەوام دەبیت لەسەری ئەگەر چی کردەوەیەکی کەمیش بێت بۆیە دەتوانی شەوانە سێ ڕکات نوێژی ویتر بکەیت و ئەو پاداشتە بەدەست بهێنیت :

دایکمان عائیشە(رضي اللّٰه عنها) دەڵێ: رسول اللّٰه ﷺ فەرموویەتی: خۆشەویسترینی کردەوەکان لەلای اللّٰه تعالی بەردەوامترینیانە ئەگەرچی کەمیش بێت. ڕاوی دەڵێ: عائیشة گەر کردەوەیەکی ئەنجام دابوایە ئەوا بەردەوام دەبوو لەسەری .

عَنْ عَائِشَةَ ، قَالَتْ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: " أَحَبُّ الْأَعْمَالِ إِلَى اللَّهِ تَعَالَى أَدْوَمُهَا وَإِنْ قَلَّ ". قَالَ : وَكَانَتْ عَائِشَةُ إِذَا عَمِلَتِ الْعَمَلَ لَزِمَتْهُ.

📚رواه مسلم ا ۱۷۸۳ ا ، والبخاري ا ٦٤٦٥ ا.

کەوایە بەردەوام بە لەسەری گەر بە سێ ڕکاتیش بێت تەرکی مەکە کارێکی کەمەو پاداشتێکی زۆرو نەبڕاوەیە ، واللّٰه تعالی اعلم .

فنسأل الله عز وجل أن يعجل فرج هذه الأمة اللهم أقم علم الجهاد واقمع أهل الزيغ والفساد وانشر رحمتك على العباد. يا من له الدنيا والآخرة وإليه المعاد وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين.